# تفسير القرآن العظيم

مسنداً عن

الرسول صلى الله عليه وسلم والصحابة والتابعين

للإمام الحافظ الناقد المفسر

أبي محمد عبد الرحمن بن أبي حاتم الرازي

رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى

المُتَوَفّى سَنَة ٣٢٧هـ

سورەتی : النساء

"وەرگێڕانی : علیكم بالسنة"



١ - | مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ | (سورة النساء - ١)

**مقاتل بن حيان** لەم ئایەتە : | وَبَثَّ مِنۡهُمَا | .

دەڵێت : لە ئادەم و حەوادا لەوانەوە پیاوانێک و ئافرەتانێکی زۆر دروستبوونە .

٢ - **سعيد بن جبير** لە بارەی ئەم ئایەتە : | وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ | (سورة النساء - ٢) .

دەڵێت : کەوا پیاوێک هەبوو لە غطفان کە سەروەتێکی زۆری لابوو کە هی کوڕی برای بوو کە یەتیم بوو، کاتێ ئەو کوڕە یەتیمە بالغ بوو، داوای ماڵەکەی کرد، بەڵام مامی ڕێگری لێکرد و پێی نەدا، ئیتر ئەم مناقشەیان بردە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەم ئایەتە دابەزی : | وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ | واتە بەخێوکارانی یەتیم - کە بەخێوکردن و ماماڵەکردنی دەگرێتە

ئەستۆ تاوەکو دەگاتە تەمەنی پێگەیشتن - ، دەفەرموێت : ماڵ و سەروەتی یەتیمەکان پێیان بدەنەوە .

٣ - **أبي صالح** لەم ئایەتەدا : | وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ | (**سورة النساء - ٢**) .

دەڵێت : ڕزقەکانتان حەرام مەکەن پێش ئەوەی ڕزقە حەلاڵەکانتان پێ بدرێت کە لە قەدەر بۆت دانراوە .

---

: واتە کاتێ لە قەدەری ئینسان شتێکی حەلاڵی بۆ نوسراوە، بەڵام ئەو بەشێوەی حەرام بەدەستی دێنێت، وە ئارام ناگرێ تا حەلاڵەکەی بەنسیب بێت، خۆی تووشی حەرامیەکە دەکات، والله اعلم .

٤ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا | (**سورة النساء - ٢**) .

دەڵێت : تاوانێکی گەورەیە .

٥ - وە بەهەمان شێوە ڕیوایەت کراوە لە الحسن و سعید بن جبیر و مجاهد و عکرمة و ابن سیرین، چەندی تر .

---

: لە تەفسیردا گەر ناوی حسن یان الحسن هاتبوو ئەوا مەبەستی الحسن البصري یە، چونکە گەر مەبەستی حسن ی کوڕی ئیمام علي بێت رضي الله عنهما، ئاماژەی پێدەدات و لە حاشیەکە دەنوسرێت، والله اعلم .

٦ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ | (سورة النساء - ٤) .

دەڵێت : مانای (النحلة) واتە : مارەیی .

٧ - **أبي صالح** لەم ئایەتەدا : | فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا | (سورة النساء - ٤ ) .

دەڵێت : پیاو گەر کچەکەی بەشوو بدایە ئەوا مارەییەکەی وەردەگرت، بەڵام نەهی کراوە لەمەدا - واتە پێشوو ئاوا بووە بەڵام دواتر رێگری لێکرا - .

٨ - **سعيد بن جبير** لە قەولی الله تعالی : | فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ | (سورة النساء - ٦) .

دەڵێت : واتە : ماڵی یەتیمەکان بۆیان بگەڕێننەوە کاتێ گەورەبوون .

٩ - **أم المؤمنين عائشة** رضي الله عنها لەم ئایەتەدا : | وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ | (سورة النساء - ٦) .

دەفەرمووێت : ئەم ئایەتە دابەزیوە دەربارەی وەلی یەتیم کە بەخێوی دەکات، ئەگەر پێویستی بەو پارەیەی ئەو یەتیمە بوو وە بە باشە بەکاری بێنێ ئەوا هیچی تیا نیە لەو ماڵە بخوات .

١٠ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ | **(سورة النساء - ١١)** .

دەڵێت : گوێڕایەڵیتان بۆ الله وەک لە باوکتان و منداڵەکانتان ئەوا پلەتان بەرز دەکاتەوە لای الله لە ڕۆژی قیامەت، لەبەرئەوەی الله سبحانه شەفاعەتی ئیمانداران هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان قەبوڵی دەکات .

١١ - **سعيد بن جبير** لەم ئایەتەدا : | فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ | **(النساء - ١١)** .

دەڵێت : واتە : ئەوەی کە باسکراوە لە بەشکردنی میراتدا .

١٢ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ | **(سورة النساء - ١٣)** .

دەڵێت : زەرەر گەیاندن لە وەسیەتدا - مەبەستی ئەوانەی کە وەسیەتی خراپ و زەرەر دەکەن، والله اعلم - .

١٣ - بە هەمان شێوە گێڕدراوەتەوە لە الحسن .

١٤ - **سعيد بن جبير** لەم قەولەی الله تعالی : | رَّحِيمًا | (**سورة النساء** - ١٦)

.

دەڵێت : - بەزەیی و میهرەبانە لەگەڵیان - لەدوای تەوبەکردن .

---

: ئەمە تەفسیری سەلەفە، کە زۆربەی خەڵک لە بەزەیی و میهرەبانی الله هەڵە تێگەشتوون .

١٥ - **مجاهد** لەم ئایەتەدا : | إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ | (**النساء** - ١٧) .

دەڵێت : هەرکەسێ تاوان بکات جا گەنج بێت یان پیر ئەوە بە نەزانیە .

١٦ - **الربيع** لەم ئایەتەدا دەڵێت : ئەوانە ئەهلی ئیمانن .

---

: واتە کە تەوبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوە ئەوانە ئەهلی ئیمانن، چونکە لایان ناخۆشە کە سەرپێچی الله یان کردووە، والله اعلم .

١٧ - **الضحاك** لەم ئایەتەدا : | إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ | (**النساء** - ١٧) .

دەڵێت : - کاتێ کە تاوان دەکەن بە نەزانی - نەزانیەکە ئەوە نیە کە بزانێت ئەوە حەرامە یان حەڵاڵە، بەڵکو لە نەزانی لەوکاتی داخلی تاوانەکە بووە .

---

: واتە کە الله ئەفەرموێت : | بِجَهَٰلَةٍ | مانای نەزانی حەرام و حەڵاڵیەکە نیە بەڵکو نەزانی لەوکاتی داخلی بە تاوانەکە بووە، والله اعلم .

١٨ - **مجاهد** لە هەمان ئایەت دەڵێت : هەرکەسێ سەرپێچی پەروەردگار بکات ئەوا جاهیلە، هەتاوەکو دەردەچێت لەو سەرپێچیە و وازی لێدێنێت .

١٩ - **مجاهد** لەهەمان ئایەت دەڵێت : هەرکەسێ کارێکی خراپ بکات، یان تاوانێکی هەڵە بکات، یان بە ئەنقەست بیکات ئەوا جاهیلە تا ئەوکاتەی وازی لێدێنێت .

٢٠ - بەهەمان شێوە لە قتادة و عمر بن مرة و الثوري ڕیوایەت کراوە .

٢١ - **أبي العالية** لەم ئایەتەدا : | وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ | **(سورة النساء - ١٨)** .

دەڵێت : ئەوە مەبەستی لەناو ئەهلی نیفاقە .

٢٢ - سفیان الثوري لەهەمان ئایەت دەڵێت : شیرکە .

٢٣ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ | (سورة النساء - ١٩) .

دەڵێت : زینایە .

٢٤ - بەهەمان شێوە لە ابن مسعود، و سعید بن جبیر، و الحسن، و الشعبي، و سعید بن جبیر، و مجاهد، و محمد بن سیرین، وە عكرمة لەیەكێ لە ڕیوایەتەكان، وە الضحاك ئەویش لەیەكێ لە ڕیوایەتەكان وادەڵێت .

٢٥ - ابن عباس دەربارەی هەمان ئایەتە دەڵێت : الفاحشة المبینة : ئەوەیە كە ئافرەت كاری ناشرین و خراپ لەگەڵ ئەهلی پیاوەكەی بكات و ئازاریان بدات .

٢٦ - بە هەمان شێوە لە أبي بن كعب ڕیوایەت كراوە .

٢٧ - وە یەكێ لە قەولی عكرمة بەهەمان شێوەیە .

٢٨ - **مقاتل بن حیان** لەو ئایەتەدا : | وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ | .

دەڵێت : واتە مامەڵە و هاوەڵێتیان بكەن بەچاكە .

٢٩ - **مقاتل بن حیان** لەم ئایەتەدا : | فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا | .

دەڵێت : ئەوەیە کە ئافرەتەکە تەڵاق بدرێت و پاشان زەواج لەگەڵ پیاوێکی تر بکات، جا لەو زەواجە الله مناڵێکی پێ ببەخشێت .

٣٠ - **ابن عباس** لەم ئایەتە : | فَعَسَىٰٓ | .

دەڵێت : (عسى) واجبە لە الله وە - واتە وشەی (عسى) بە مانای واجب دێت کە تەواو هەر ئاوا دەبێت بەبێ شک - .

٣١ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا | .

دەڵێت : الله خێرێکی زۆر دەکاتە ئەو منداڵەی کە پێیان دەبەخشێت .

٣٢ - **مجاهد** لەم ئایەتەدا : | وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا | .

دەڵێت : لەوانەیە الله لەو پێناخۆشبوونە خێری تێکردبێ .

٣٣ - **ابن عباس** لە هەمان ئایەت دەڵێت :

(الخير الكثير) : ئەوەیە کە پیاوەکە لەگەڵ ئافرەتەکە میهرەبانە و بەسۆزە لەگەڵی - والله اعلم واتە دوای ئەوەی کە ڕقی لەو زەواجەش بێت بەڵام هەر باشە لەگەڵی و ئارامگرە لەسەری - ، ئەوا الله ڕزقی منداڵ بە پیاوەکە دەبەخشێت .

٣٤ - **السدي** لەم ئایەتەدا | وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ | (سورة النساء - ١٦) .

دەڵێت : ئەوانە گاور و جولەکەن .

٣٥ - **مجاهد** لەم ئایەتە : | يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ | .

دەڵێت : زینایە .

٣٦ – بە هەمان شێوە لە ابن عيينة ڕیوایەت كراوە .

٣٧ - **مجاهد** لەم ئایەتەدا : | مَيۡلًا عَظِيمًا | .

وتی : دەیانەوێت كە وا زینا بكەن .

٣٨ - وە **مقاتل بن حيان** لەم ئایەتەدا : | أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمًا | .

دەڵێت : مەیل و لادانی گەورە ئەوەیە كە یەهودیەكان دەیانەوێت كەوا بڵێن هاوسەرگیری خوشك لە باوكدا حەڵاڵە لەلایەن الله ەوە .

٣٩ - **ابن طاوس** لە باوكیەوە لەو ئایەتەدا : | وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفًا | (سورة النساء - ١٦) .

دەڵێت : لە كاروباری ئافرەتاندا، واتە ناتوانن لەسەریان ئارام بگرن .

٤٠ - **وكيع** دەڵێت : پیاو لەلای ئافرەتاندا عەقڵی دەڕوات .

٤١ - **عبد الله** لەم ئایەتەدا : | يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ |

دەڵێت : ئەو ئایەتە موحکەمە و نەسخ نەکراوەتەوە، وە تاوەکو ڕۆژی قیامەت نەسخ ناکرێتەوە .

**٤٢** - | إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ | **(سورة النساء - ٣١)**

لەم ئایەتەدا چەند تەفسیرێک هەیە :

**أ** - **إبن عباس** خواردنەوەی ئارەقی بەیەکێ لە گەورەی گەورەترینەکان ژماردووە - لەڕووی تاوانکردنەوە - .

**ب** - **أبي قتادة** واتە **العدوي** وتی : نامەکەی عمر رضي الله عنه بۆ ئێمە خوێندرایەوە : لە کەبائیر ئەوەیە کە دوو نوێژ کۆبکەیتەوە، واتە بەبێ هیچ عوزرێک - دوو نوێژ کۆبکەیتەوە - .

**ج** - **عبد الله** وتی : کەبائیر لە سەرەتای سوڕەتی النساء دایە تاوەکو | إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ | .

**د** - **ابن عباس** دەڵێت : هەرچی الله بەڵێنی ئاگری لەسەر دابێت ئەوا کەبیرەیە .

**٤٣** - **السدي** لەم ئایەتەدا : | نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ | .

دەڵێت : تاوانە بچووکەکانە .

٤٤ - وە **السدي** لەم ئایەتەدا : | وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا | (**سورة النساء** - ٣١)

.

دەڵێت : ئەوە جوانیە لە بەهەشت .

٤٥ - وە **قتادة** دەڵێت : المدخل الكريم : ئەوە بەهەشتە .

٤٦ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ | (**سورة النساء** - ٣١) .

دەڵێت : واتە نابێ تەمەننا بکات و بڵێت : خۆزگە ماڵی فلان هی من دەبوو یان ئەهلەکەی هی من دەبوو، الله سبحانە نەهی لەوە کردووە، بەڵکو داوا لە فەزڵی الله بکە .

بە هەمان شێوە لە محمد بن سيرين و الحسن و عطاء و الضحاك ڕیوایەت کراوە .

٤٧ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | قَٰنِتَٰتٌ | (**سورة النساء** - ٣٤) .

دەڵێت : واتە : گوێڕایەڵێکاران لە ئافرەت .

٤٨ - وە لە مجاهد و عكرمة و أبي مالك و عطاء و قتادة و السدي بەهەمان شێوە ڕیوایەت کراوە .

٤٩ - تەفسیری | وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ | (**سورة النساء** - ٣٦) .

٥٠ - **ابن عباس** دەڵێت : | وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنْبِ | هاوڕێیە .

٥١ - **عكرمة** دەڵێت : | وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنْبِ | ئەوەی کە ڕەفیقیت دەکات لە سەفەردا .

٥٢ - بە هەمان شێوە لە قتادة ڕیوایەت کراوە .

٥٣ - **زيد بن أسلم** دەڵێت : | وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنْبِ | ئەوە ئەوکەسەیە کە لە حازر لەگەڵتدا دادەنیشێت، وە هاوڕێیەتیت دەکات لەسەفەردا .

٥٤ - **سعيد بن جبير** دەڵێت : | وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنْبِ | ڕەفیقێکی صالح و چاکەکارە .

٥٥ - تەفسیری | وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ | **(سورة النساء - ٣٦)** .

٥٦ - **ابن عباس** دەڵێت : ئەوە میوانێکی هەژارە کە دێتە لای مسوڵمانان .

٥٧ - بە هەمان شێوە لە سعد بن جبير ڕیوایەت کراوە .

٥٨ - **مجاهد** دەڵێت : ئەوکەسەیە کە بەلاتدا تێدەپەڕێت و مسافرە .

٥٩ - **قتادة** لەم ئایەتەدا : | ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ | **(سورة النساء - ٣٧)** .

دەڵێت : ئەهلی کیتاب دوژمنی الله ن، بەخیلی دەکەن لە حەقی الله بەوەی لەسەریانە .

٦٠ - **زيد بن أسلم** دەڵێ : البخيل : ئەوەیە کە لە ماڵەکەی خۆی حەقی الله نادات - واتە چرووکی دەکات و نابەخشێت - .

٦١ - بە هەمان شێوە لە قتادة و الأوزاعي ڕیوایەت کراوە .

٦٢ - **مجاهد** دەربارەی ئەم ئایەتە : | وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا | **(سورة النساء - ٣٧)**

دەڵێت : دەربارەی یەهود دابەزیوە .

وە بەهەمان شێوە دەڵێت ئەم ئایەتە : | وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا | **(سورة النساء - ٣٨)** .

دەربارەی یەهود دابەزیوە .

٦٣ - | يَبۡخَلُونَ | بەو جۆرەش تەفسیر کراوە کە کەسێ عیلمێکی لایە و دەیشارێتەوە بەڵام بە هۆی ئیسنادەکەی دامنەنا، لێرەشدا گەر ئیسنادەکەش صحیح نەبێت بەڵام ماناکەی صحیحە .

- قوله تعالی : | يُضَٰعِفۡهَا | **(سورة النساء - ٤٠)** .

٦٤ - **عبد الله بن مسعود** دەڵێ : ئومەت و بەندە دەهێنرێت لە ڕۆژی قیامەتدا، پاشان بانگدەرێک بانگ دەکات لەسەری یەکەمینەوە بۆ کۆتایی :

ئەوە فلانی کوڕی فلانە، کێ حەقی لایەتی با بێت حەقەکەی وەرگرێتەوە، پاشان ئافرەت دڵخۆش دەبێت بەوەی کە حەقەکەی بۆ دەچۆڕێتەوە و وەردەگیرێتەوە کە لەسەر باوکی یان برای یان هاوسەرەکەی هەیبووە، ئا لەو ڕۆژەدا هیچ پلەو پایەک لەنێوانیاندا نییە وە هیچ ناپرسن، الله لە حەقی خۆی خۆشدەبێت ئەوەی کە ویستی لێ بێت، بەڵام لە حەقی خەڵکی خۆشنابێت، ئەوەی کە حەقی خەڵکی لەسەرە ڕادەگیرێت، بانگی دەکرێ : ئەوە فلانی کوڕی فلانە، هەرکەسێ حەقی لایەتی با بێت حەقەکەی وەرگرێتەوە، پاشان دەڵێ : دونیا تەواو بووە و نەماوە لەکوێ حەقیان پێ دەدرێتەوە؟

وتی : کردەوە چاکەکانی وەرگرە، ئینجا هەموو ئەوانەی حەقیان ماوە بە قەدەر داواکەی کردەوە چاکیان پێ دەدرێت، ئەگەر ڕێزداری لای الله بێ، ئەوا فەزڵی یەک مسقال زەڕڕەی بۆ هەیە کە الله تعالی بۆی زیاد دەکات تاوەکو دەچێتە بەهەشت .

پاشان بۆمانی خوێندەوە : | إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ | ، دەفەرمووێت : بیخەنە بەهەشت .

ئەگەر بەندەیەکی خراپ بێت و چاکەی نەبێ ئەوا فریشتە دەڵێ : کردەوە چاکەکانی تەواو بووە و نەماوە، وە داواکارێکی زۆر ماون - واتە ئەوانەی داوای حەقیان خۆیان لێی دەکەن زۆر ماون و کەچی بەندەکەش کردەوەی چاکی نییە و تەواو بووە - .

دەفەرمووێت : خراپەکانیان لێ وەرگرە - واتە خراپە لە خاوەن حەقەکان وەرگرە و بیخەنە سەر ئەو کەسەی کە حەقەکەی خواردووە - ، خراپەی بۆ زیاد بکەن، پاشان چەکێکی بۆ بنوسن لە چەکەکانی ئاگر .

**٦٥ - عبد الله** وتی : رسول الله ﷺ پێی وتم : بخوێنە، ئینجا منیش سورەتی النساء دەستم پێکرد تاوەکو تەواوکرد هەتا وتەی الله تعالى : | فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا | **(سورة النساء - ٤١)** .

**٦٦ - عبد الله** وتی : پێغەمبەر ﷺ چاوەکانی گریان، پاشان فەرمووی : بەسمانە .

---

: والله أعلم لەگەڵ ئایەتەکەیتی کە کافیە و بەسمانە بۆ ئەوەی ببێتە ئامۆژگاری بۆمان .

٦٧ - **عمر** رضي الله عنه دەفەرموێ : یا الله بابەتی ئارەق بۆمانی ڕوونکەیتەوە، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی : | قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ | **(سورة البقرة - ٢١٩)** .

فەرمووی : یا الله بابەتی ئارەق بۆمانی ڕوونکەیتەوە، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی : | لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ | **(سورة النساء - ٤٣)** .

فەرمووی : یا الله بابەتی ئارەق بۆمانی ڕوونکەیتەوە، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی : | إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ | **(سورة المائدة - ٩٠)** .

تاوەکو گەیشتە : | فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ | **(سورة المائدة - ٩٠)** .

٦٨ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ | **(سورة النساء - ٤٣)** .

دەڵێ : نەسخ بۆتەوە بەو ئایەتە : | يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ | **(سورة المائدة - ٦)** .

٦٩ - بەهەمان شێوە لە عكرمة و مجاهد و الحسن و الضحاك و قتادة ڕیوایەت کراوە .

٧٠ - **ابن عباس** لەو ئایەتەدا : | وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ | **(سورة النساء - ٤٣)** .

دەڵێت : نابێ بچنە مزگەوت لە کاتێ کە لەشگرانن ئیللا ئەوانە نەبێ کە لەڕێگا دەبڕن لە سەفەردا .

دەڵێ : جارێ بە مزگەوت تێدەپەڕێ و دانانیشێ لەناو مزگەوت .

بە هەمان شێوە لە عبد الله بن مسعود، أنس بن مالك، سعيد بن المسيب، أبي الضحى، عطاء، مجاهد، مسروق، ابراهيم النخعي، زيد بن أسلم، أبي مالك، عمرو بن دينار، الحكم بن عتيبة، عكرمة، الحسن البصري، يحيى بن سعيد الأنصاري ابن شهاب، قتادة، ڕیوایەت کراوە .

- تەفسیری | أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ | **(سورة النساء - ٤٣) .**

٧١ - **ابن عباس** دەڵێت : جیماعە .

٧٢ - بە هەمان شێوە ڕیوایەت کراوە لە : علي، أبي بن كعب، مجاهد، طاوس، الحسن، عبيد بن عمير، سعيد بن جبير، الشعبي، قتادة، مقاتل بن حيان .

٧٣ - **عبد الله** دەڵێ : (اللمس) هەر شتێکە لە غەیری جیماع .

کە بەهەمان شێوە ڕیوایەت کراوە لە : ابن عمر، عبيدة، أبي عثمان النهدي، أبي عبيدة، الشعبي، ثابت بن الحجاج، ابراهيم النخعي، زيد بن اسلم .

ئینجا لە حاشیەکە چەند دەلیلێکی تر نوسراون وەک :

- **ابن سيرين** دەڵێ پرسیارم لە عبيدة كرد دەربارەی وتەی الله تعالى : | أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ | .

دەڵێ : دەستی ئاوابێ، ناودەستی گرت .

**المصنف لإبن أبي شيبة ١٦٦/١**

- **أبي عبيدة** دەڵێ : اللمس بێجگە لە جيماعە .

**المصنف لإبن أبي شيبة ١٦٦/١**

٧٤ - علي رضي الله عنه لەم ئايەتەدا : | فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءً | **(سورة النساء - ٤٣)** .

دەڵێت : ئەوەیە كە تووشی لەشگرانیێ ئاویشی دەستنەكەوێ، ئەوا تەیەموم دەكات و نوێژ دەكات تاوەكو ئاو دەدۆزێتەوە .

٧٥ - **ابن عباس** لەم ئايەتەدا : | فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا | **(سورة النساء - ٤٣)** .

دەڵێت : گەر كەسی نەخۆش ترسا لە بەكارهێنانی ئاو بۆخۆی - واتە ترسا لەوەی كە نەخۆشیەكەی خراپتر بكات - ئەوا تەیەموم بكات .

- | إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا | **(سورة النساء - ٤٣)** .

٧٦ - **سعيد بن المسيب** دەڵێت : هیچ شتێک بەقەد لێخۆشبوون لام خۆشەویستر نییە - واتە لێخۆشبوون لەهەموو شتێ لام خۆشەویسترە - .

٧٧ - **عكرمة** لەم ئایەتەدا : | وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا | (**سورة النساء - ٤٦**) .

دەڵێت : ئەم ئایەتە دابەزی بۆ رفاعة بن زيد التابوت، کە یەکێ بوو لە گەورانی یەهود .

٧٨ - **السدي** دەڵێ لەم ئایەتەدا : | يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ | (**سورة النساء - ٤٧**) .

دەڵێت : ئەم ئایەتە دابەزی بۆ مالك بن الصيف، وە رفاعة بن زيد السائب لە بەنی قەینوقاع .

٧٩ - کەسی حەسوود دوژمنی نیعمەتی اللّٰه یە .

لەم ئایەتە : | أَمْ يَحْسُدُونَ | (**سورة النساء - ٥٤**) .

**ابن عيينة** دەڵێت : اللّٰه تبارك وتعالى دەفەرموێت : کەسی حەسوود دوژمنی نیعمەتی منە، وە ڕقی لە قەزاو قەدەری منە، ڕازی نییە بەو بەشەی کە وا بۆیم بەشکردووە و پێمداوە .

: جا ئیسنادەکەی صحیح ە، ئەم تەفسیرە کافیە بۆ ئەوەی وازبێنی لەوەی هەر بەدوای نیعمەت و فەزڵانە بیت کە بە کەسێ تر دراون، چونکە تەنیا غەم و قەلەقی و تورەبوونی الله بەدەست دێنی .

٨٠ - **الحسن** لەم ئایەتەدا : | كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا | **(سورة النساء - ٥٤)** .

دەڵێت : لە ڕۆژێکدا پێستیان حەفتا هەزار جار دەگۆڕێت .

٨١ - **حسين** دەڵێ : وە لە فضيل ئەوەشی بۆ زیادکراوە، لە هشام، لە الحسن : هەرجارێ کە پێستیان گۆڕدرا، وە گۆشتیان خواردرا، پێیان دەوترێ : بگەڕێنەوە، پاشان دەگەڕێنەوە .

---

: واتە کە پێستەکانیان گۆڕدرا بۆ پێستی تر تا ئازاریان زیاتر بێ، وە گۆشتەکانیان خورا، پێیان دەوترێ بگەڕێنەوە واتە گۆشت و پێستەکە وەک خۆی لێبێتەوە دووبارە ئازار بدرێنەوە، يارب سلّم، يارب سلّم، يارب سلّم .

٨٢ - **مجاهد** لەم ئایەتەدا : | وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ | **(سورة النساء - ٧٥)** .

دەڵێت : فەرمان بە ئیمانداران کرا کە بجەنگن بۆ لاوازکراوانی ئیماندار لە مەککە .

٨٣ - | وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ | **(سورة النساء - ٧٥)**

**ابن عباس** دەڵێت : من و دایکم لە لاوازکراوان بووین .

وە لە حەدیثی ابن ابي عمر ئەوەی بۆ زیادکراوە : لە پیاوان و ئافرەتان و منالآن، من لە منداڵەکان بووم، وە دایکیشم لە ئافرەتان بوو .

٨٤ - **الحسن** و **قتادة** لەم ئایەتەدا : | أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا | **(سورة النساء - ٧٥)** .

دەڵێن : - پیاوێک - لە گوندێکی ستەمکارەوە دەرچوو بۆ گوندێکی چاک، لەڕێگادا مردن ڕێی پێگرت، بە زەحمەتیەوە بەسەر سینگەوە خۆی گەیاندە گوندە چاکەکە، وتیان : نەمرد ئیللا بەوشێوازە نەبێت، فریشتەی ڕەحمەت و فریشتەی سزا لەوێدا بووە مناقەشەیان - کە ئایە کامیان ڕۆحی بکێشێت - ، فەرمانیان پێدرا کە پێوانەی هەردوو گوندەکە بکەن کە لەوەوە نزیکترینە، دیتیان لە گوندە چاکەکەوە نزیکترە بە بستێک، وە هەندێکیان دەڵێن : الله نزیکی کردووتەوە لە گوندە چاکەکەوە، پاشان فریشتەی ڕەحمەت ڕۆحی کێشا .

٨٥ - | وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ | **(سورة النساء - ٧٧)** .

**الزهري** دەڵێ: (إقامتها): ئەوەیە کە هەر پێنج نوێژەکە لە کاتی خۆیدا بکەیت.

**٨٦** - دونیا هەروەکو خەونێکە!

**الحسن** لەم ئایەتەدا: | قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ | (سورة النساء - ٧٧).

دەڵێ: ڕەحمەت لەو بەندەیەی کە ژیان دەکات بەپێی ئەوە - واتە بەپێی ئەو ئایەتە کە ژیانی بچووک و کەم کردووتەوە -، مەگەر دونیا چیە هەموو دونیا لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئیللا وەک پیاوێکە کە دەخەوێت و خەونێ دەبینێ، لەو خەونەدا شتانێک دەبینێ کە خۆی حەزی لێیە، پاشان بە ئاگا دێتەوە.

**٨٧** - **قتادة** لەم ئایەتەدا: | أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا | (سورة النساء - ٨٢).

دەڵێت: واتە: وتەی الله تعالی هیچ جیاوازی و ناکۆکی تێدا نیە، حەقە و باتڵ نییە وەکو وتە و قسەی خەڵک کە جیاوازی تێدایە.

**٨٨** - تەفسیری | أَذَاعُوا۟ بِهِۦ | چییە؟

**عمر بن الخطاب** رضي الله عنه دەفەرمووێت: کاتێ رسول الله ﷺ ئیعتزالی کرد و خۆی تەنیا کرد لە هاوسەرەکانی، چووە مزگەوت، جا خەڵکەکە لە زەویاند دەدا و دەیانوت: رسول الله ﷺ خێزانی تەڵاق داوە، ئەو

باسەش پێش ئەوەبوو کە فەرمان بە حیجاب بکرێ، عمر رضي الله عنه فەرمووی : هەڵسام چوومە سەر دەرگای مزگەوت بانگم کرد بە بەرزترین دەنگم :خێزانی تەڵاق نەداوە، پاشان ئەو ئایەتە دابەزی : | وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٌ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ | (سورة النساء - ٨٣) .

٨٩ - الله تعالى دەفەرموێت : | فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا | (سورة النساء - ٩٩) .

دەکرێت لێرەدا وا مانا بکرێت کە لەوانەیە الله لێیان خۆش بێت کە ئافرەتان و لاوازکراوەکان بوون؟

یان بڵێی نا الله لێیان خۆشنابێت، لەکاتێکدا لەدوای خۆی ئەوە هاتووە | وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا | .

بۆ ئەوانی تریش هەروایە، کەواتە کە دەڵێین بەمانای واجب دێت واتە تەواو ئەوشتەی لەدوای | عَسَى | ەوە دێت دەکرێت و دەبێت - تەماشای ئەثەری ژمارە ٣٠ بکە - .

٩٠ - **سعيد بن جبير** لەم ئایەتەدا : | وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٍ أَن يَقۡتُلَ مُؤۡمِنًا إِلَّا خَطَـٔٗاۚ | (سورة النساء - ٩٢) .

دەڵێت : ئەوە عیاش بن أبي ربيعة المخزومي ە کە سوێندی خوارد لەسەر حارث بن يزيد مەولای بني عامر بن لؤي بۆ کوشتنی، کە ئەوکات حارث

مشریک بوو، پاشان حارث مسوڵمان بوو، بەڵام عیاش پێی نەزانیبوو، ئیتر لە مەدینە پێی گەیشت و کوشتی، جا ئەو کوشتنەی بە هەڵە بوو - بەمەبەست نەیکوشت - .

**٩١** - بە هەمان شێوە السدي ڕیوایەتی کردووە .

**٩٢** - **عطاء** لەم ئایەتەدا : ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ﴾ **(سورة النساء - ٩٢)** .

دەڵێت : ئەوەی کە لەسەر ئیسلام لەدایک بووبێ .

**٩٣** - **ابن عباس** لە هەمان ئایەت دەڵێت : مانای ﴿مُّؤۡمِنَةٖ﴾ ئەوەیە کە : ئیماندارێکی عاقڵ بێت، وە ڕۆژوو بگرێ و نوێژ بکات .

**٩٤** - **سعيد بن جبير** وتی : پاشان جیای کردەوە، پاشان وتی : ﴿إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْۚ﴾ **(سورة النساء - ٩٢)** .

واتە : ئەوەیە کە نزیکەکانی کەسی کوژراو لە خوێنی بکوژەکە خۆشبن کە ئەوە باشترە بۆیان، ئەگەرنا ئازادکردنی کۆیلە لەماڵەکەی واجبە لەسەر کەسی بکوژ - ئەمە بۆ کوشتنی کەسێکی ئیمانداره بە هەڵە - .

**٩٥** - **السدي** لە هەمان ئایەت دەڵێت : واز لە خوێنەکە بهێنێت .

**٩٦** - بە هەمان شێوە لە ابراهيم النخعي ڕیوایەت کراوە .

**٩٧ - سعيد بن جبير** لەم ئایەتەدا : | فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ | **(سورة النساء - ٩٢)** .

دەڵێت : مانای ئەوەیە کە : لە ئەهلی حەرب بێت و ئیماندار بێت، واتە کوژراوەکە .

دەڵێت : ئەو ئایەتە دابەزی دەربارەی مرداس بن عمرو کە مسوڵمان بوو، وە قەومەکەی کافر بوون و لە ئەهلی حەربدا بوو، أسامة بن زيد بە هەڵە کوشتی، | فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ | خوێنیان بۆ نییە، چونکە لە ئەهلی حەربدا بوونە .

**٩٨ - پرسیار لە مسروق** کرا دەربارەی ئەو ئایەتە : | فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ | **(سورة النساء - ٩٢)** .

پرسیاریان لێکرد دەربارەی بەڕۆژوو بوونی دوو مانگ بەدوای یەک کە بۆ کۆیلەیەکی ئازادە ئەو دوومانگ بەڕۆژوو بوونە یان بۆ خوێن و کۆیلەکەیە .

وتی : هەرکەسێ نەیتوانی خوێن بدات و کۆیلە ئازاد بکات .

**٩٩ -** دەربارەی | مُتَتَابِعَيْنِ | .

لە **مجاهد**ەوە : کە پرسیاریان لێکرد دەربارەی بەڕۆژوو بوونی دوومانگ لە دوای یەک : وتی : هیچ ڕۆژوویەکی ناشکێنێ، وە ڕۆژووەکەی هیچ ناپچڕێنێ، ئەگەر ئاوای کرد بەبێ ئەوەی نەخۆش بێت یان عوزری هەبێت ئەوا گشت ڕۆژووەکانی لێ قبوڵ دەکرێت، وە ئەگەر نەخۆشیەک ڕووی تێکرد یان عوزرێکی هەبوو، ئەوا ئەوەی ماویەتی ڕۆژووەکەی دەگرێت. وە ئەگەر مرد و بەڕۆژوو نەبوو، ئەوا خواردن دەدات بە شەست هەژار، بۆ هەر هەژارێک مدێکی پێ دەدرێت .

**١٠٠** - | فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ | **(سورة النساء - ١٠٢)** .

**مجاهد** دەڵێت : الطائفة مانای : پیاوێکە تا هەزار پیاو - واتە لە ژمارەیان - .

**١٠١** - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ | **(سورة النساء - ١٠٣)** .

دەڵێت - کە وا زیکر و یادی الله بکرێت - : لە شەو و ڕۆژدا، وە لە وشکانی ئاویدا، وە لە سەفەر و حازریدا کە لە سەفەر نییە، وە لە دەوڵەمەندی و هەژاریدا، وە لەکاتی نەخۆشی و ساغ و سەلامەتیدا، وە لە نهێنی و ئاشکراییدا وە لە هەموو حاڵێکدا .

**١٠٢** - لە **قتادة** لەم ئایەتەدا : | إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا | **(سورة النساء - ١٠٣)** .

کە وا **ابن مسعود** دەڵێت : بۆ نوێژ یەک کاتە، وەک کاتی حەج .

: واتە وەک چۆن بۆ حەج یەک کات هەیە و خەڵک ئیللا لەو کاتی دەتوانێ حەج بکات ئاواش نوێژ یەک کاتی دیاریکراوی هەیە .

**١٠٣** - دەربارەی ئەم ئایەتە : | لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ | **(سورة النساء - ١٠٥)** .

**ابن وهب** دەڵێت : **مالك** بە منی وت : ئەو حوکمەی کە لەنێوان خەڵکی حوکمی پێدەکرێت دوو جۆرە :

کەسێ کە حوکم بە قورئان سوننەت دەکات، کە ئەو حوکمەش واجبێکی تەواو و ڕاستە،

وە حوکمێک کە عالمێکە و ئیجتیهاد ئەکا - ئەو کاتەی کە لەقورئان سوننەت نەبوون - بەڵکو بیپێکێ .

وتی وە سێیەم : کەسێکە زۆر لە خۆی دەکات بۆ شتێک کە نایزانێ، جا ئەوە و ماوشێوەکانی ناپێکێ .

**١٠٤** - **أحمد بن داود** دەربارەی ئەم ئایەتە : | إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا | **(سورة النساء - ١٠٨)** .

وتی : الله تعالى عیلمی بەهەموو شتێکدا هەیە، نەفەرمووە لەگەڵ هەموو شتێکدایە .

١٠٥ - **ابن أسماء الفزاري** دەڵێت : گوێم لە علي رضي الله عنه بوو دەیفەرموو : کاتێ لە رسول الله ﷺ حەدیسێکم بیست الله سوودی پێگەیاندم بەوشتەی کە ویستی لێبوو سوودم پێ بگەیەنێت .

ئیمام علي رضي الله عنه فەرمووی : أبو بکر بۆی گێڕامەوە أبو بکر رضي الله عنه ڕاست دەکات، کە رسول الله ﷺ دەفەرموێت : هیچ بەندەیەک نییە کە تاوانێک ئەنجام بدات، پاشان دەستنوێژ بگرێت و دوو ڕکعات نوێژ بکات، پاشان داوای لێخۆشبوون لە الله بکات ئیللا الله لێی خۆشدەبێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : | وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا | (**سورة النساء** - ١١٠) .

١٠٦ - **مقاتل بن حيان** لەم ئایەتەدا : | وَإِن يَدۡعُونَ إِلَّا شَيۡطَٰنٗا مَّرِيدٗا | (**سورة النساء** - ١١٧) ، دەڵێت : ئیبلیسە .

١٠٧ - **سفيان** لە هەمان ئایەت دەڵێت : هیچ بتێک نییە ئیللا شەیتانی تێدایە .

١٠٨ - الله ڕەددیان دەداتەوە !

**السدي** لەم ئایەتەدا : ﴿لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ﴾ (**سورة النساء - ١٢٣**) .

دەڵێت : خەڵكی لە مسوڵمانان و یەهود و نەصارا بەیەك گەیشتن، یەهودیەكان بە مسوڵمانەكانیان وت : ئێمە لە ئێوە باشترین، دینی ئێمە پێش دینی ئێوە بووە، وە كتابی ئێمە پێش كتابی ئێوە بووە، وە پێغەمبەرمان پێش پێغەمبەری ئێوە بووە، هەروەها ئێمە لەسەر دینی إبراهیم ین، هیچ كەسێ ناچێتە بەهەشتە ئیللا كەسێ كە یەهودی بێت، وە نەصاراش هەمان شتیان وت .

مسوڵمانەكان وتیان : كتێبی ئێمە دوای كتێبی ئێوە بووە، وە پێغەمبەرمان لەدوای پێغەمبەر ئێوە بووە، وە دینی ئێمە دوای دینی ئێوە بووە، وە فەرمانتان پێكراوە كە شوێنكەوتە بن، وە وازبێنن لەوەی پێشوو فەرمانتان پێكرابوو، ئێمە لە ئێوە باشترین، ئێمە لەسەر دینی إبراهیم و إسماعیل و إسحاق ین (علیهم السلام)، وە هیچ كەسێ ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا كەسێ كە لەسەر دینی ئێمە بێت، الله ڕەددی قسەكانیان دەداتەوە و دەفەرمووێت : ﴿لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ﴾ (**سورة النساء - ١٢٣**) .

**١٠٩** - ئیماندار لە دونیا سزا دەدرێت !

لە دایكی ئیمانداران **عائشة** رضي الله عنها، كە پیاوێك ئەم ئایەتەی خوێند : ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾ (**سورة النساء - ١٢٣**)، وتی : گەر ئێمە لەسەر

هەموو ئەو کردەوانەی دەیکەین سزا بدرێین ئەوا لەناودەچین، ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی : بەڵێ، ئیمانداران لە دونیادا سزا دەدرێن لەوکاتەی تووشی بەڵاو موسیبەت دەبێت هەروەها لەوکاتەی کە جەستەی تووشی نەخۆشی دەبێت، وە هەرشتێک کە ئازاری بدات - ئەوا دەبێتە سزاییەک بۆی وەک لادانی لە قیامەتدا و پاک بوونەوەی، بەتایبەت ئەو ئیماندارانەی کە زۆر خۆشەویستن لای الله چونکە الله دەیەوێت بە پاکی بیباتەوە لای خۆی، بەڵام نەک کەسانێ کە تووشی نارەحەتی دەبن و لەسەری ناشوکری دەکەن، والله أعلم - .

١١٠ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : ﴿وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾ (سورة النساء - ١٢٣) .

وتی : ئیللا مەگەر پێش مردنی تەوبەی کردبێ، ئەوا الله تعالى لەسەری لێی خۆشدەبێت .

---

: والله أعلم مەبەستەکە ئاوایە کە هیچ کەس سەرخەر و پشتیوانی نییە لەوکاتەی کە الله بیەوێت کەسێ سزا بدات، جا ابن عباس دەڵێ : مەگەر کەسێ پێش مردنی تەوبەی لەو تاوانەی کردبێ ئەوا الله تعالى لەسەری لێی خۆشدەبێت .

١١١ - **ابن عباس** دەڵێت : سودة رضي الله عنها دەترسا کە رسول الله ﷺ تەڵاقی بدات، وتی : ئەی رسول الله ﷺ تەڵاقم مەدە و لەخۆتم بگرە، وە رۆژی منیش بدە عائشة رضي الله عنها - واتە ئەو بەشەی کە بۆی دانرابوو لە سەرەی

هاوسەرەکانی رسول الله ﷺ - ، ئیتر پێغەمبەر ﷺ وایکرد، وە ئەو ئایەتە دابەزی :

| وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا . . . | **(سورة النساء - ١٢٨)** .

**١١٢ - سعید بن جبیر** لەم ئایەتەدا : | وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا | **(سورة النساء - ١٢٨)** .

دەڵێت : ئافرەت ڕەزیلی بکات لەماڵ و سامانی مێردەکەی و کوڕەکەی .

**١١٣ - ابن أبي مليكة** دەڵێت : ئەم ئایەتە : | وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ | **(سورة النساء - ١٢٩)**، دەربارەی عائشة رضي الله عنها دابەزی .

**١١٤ - ابن عباس** دەڵێت : | وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ |، واتە : لە خۆشەویستی و جیماعدا، کە ناتوانێت دادپەروەری بکات لەنێوان خێزانەکانیدا، ئەگەرچی زۆریش پێداگیر بێ بۆ ئەوەی دادپەروەر بێ .

**١١٥** - بە هەمان شێوە **الحسن** : دەڵێت : لە خۆشەویستی و جیماعدا .

لە حاشیەکەدا ئەثەرێکی تر باسکراوە :

- **ابن سيرين** وتی : پرسیارم لە عبيدة كرد دەربارەی ئەم ئایەتە : | وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ | .

ئەویش بە دەستی ئاماژەی بۆ سینگی کردووە و پاشان وتی : لە خۆشەویستی و جیماعدا .

**[السنن : ٧/٢٩٨]**

**١١٦ - ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ | **(سورة النساء - ١٣٥)** .

دەڵێت : الله تعالى فەرمان بە ئیمانداران دەكات كەوە حەق بڵێن، وە دەوڵەمەندیان خۆشنەوێت لەبەر دەوڵەمەندیەكەی وە بەزەییان بە هەژاراندا نەیەتەوە لەبەر هەژاریەكەی .

---

لێرەدا مەبەستی ئەوەیە كە هەركام لەم دوو چینە (هەژار و دەوڵەمەند) هەرشتێكیان كرد یان كاروبارێک كە پێویستی بە شایەتیدان بوو ئەوا دەبێت ئیمانداران شایەتی بەحەق بدەن .

نەک بڵێن : فلان دەوڵەمەندە و پارە و سامانی هەیە،

یان فلان هەژارە گوناهە با تووشی هیچ نەبێت .

لە هەركامێک بێ و پێویستی بە شایەتی بوو دەبێ بەحەق شایەتی بدەیت، والله اعلم .

١١٧ - **الحسن** لەم ئایەتەدا : | إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ | **(سورة النساء - ١٤٢)** .

دەڵێت : لە ڕۆژی قیامەتدا ئیماندار ڕووناکیەکی پێ دەدرێت - تاوەکو بەهۆیەوە لە پردی صراط بپەڕێتەوە - ، وە ڕووناکیەکیش دەدرێت بە دووڕووەکان تاوەکو بەهۆیەوە بڕۆن، تاوەکو دەگەنە کۆتایی پردی صراط، کاتێ دەگەنە کۆتایی پردی صراط ئیمانداران بە ڕووناکیەکانیان تێپەڕدەبن، وە ڕووناکی دووڕووەکان دەکوژێتەوە، ئیتر بانگ دەکەن : | يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ | (**سورة الحديد** - ١٤).

**الحسن** دەڵێت : ئەوە ئەو فێڵەیە کە الله تعالى لەگەڵیاندا دەیکات .

---

: مونافیقەکان بەگومانی خۆیان وا دەزانن دەتوانن فێڵ لە الله بکەن، ئینجا لێرەدا وەک تۆڵەیەکە بۆیان، والله اعلم .

١١٨ - **قتادة** لەم ئایەتەدا : | يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ | **(سورة النساء - ١٤٢)** .

دەڵێت : والله گەر خەڵک نەبێت مونافیقەکان نوێژ ناکەن، هیچ نوێژێک ناکەن ئیللا بۆ ڕیا و سومعەیەتی .

١١٩ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | سُلْطَٰنًا مُّبِينًا | (**سورة النساء** - ١٤٤) .

دەڵێت : هەموو وشەیەکی سلطان کە لە قورئاندا هاتووە بە مانای حوججە دێت .

١٢٠ - **قتادة** لەم ئایەتەدا : | مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا | (**سورة النساء** - ١٤٧) .

دەڵێت : الله تعالى سزای ئەوکەسە نادات کە زۆر شوکرانەبژێری الله دەکات و سوپاسگوزارە، وە سزای کەسی ئیمانداریش نادات .

١٢١ - **مجاهد** لەم ئایەتەدا : | لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَۚ | (**سورة النساء** - ١٤٨) ،

دەڵێت : پیاوێ بچێتە میوانداری پیاوێکی تر، ئەویش حەقی میوانداری پێنەدات - واتە بەشێوەیەکی پێویست لە خزمەتیدا نەبێت - ، کاتێ کە دەرچوو لەماڵەکە بێتە ناو خەڵک و باسی بکات و بڵێت : میوانداری فلانم کرد بەڵام حەقی میوانداری پێنەدام،

وتی : ئەوە باسکردنی بەخراپەیە ئیللا مەگەر ستەمی لێبکات، ئەوکاتەی کە لەگەڵ کەسێکی تر ئاوابێت و حەقی میوانداری پێنەدات .

١٢٢ - تەفسیری : | وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ | (**سورة النساء** - ١٥٧) .

رسول الله ﷺ بە یەهوودیەکان دەفەرموێت : عیسى نەمردووە، وە ئەو دەگەڕێتەوە لاتان پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت .

**ابن عباس** دەڵێت : لەو کاتەی الله تعالى ویستی لێبوو کە عیسى بەرزکاتە بۆ ئاسمان، چووە لای هاوەڵەکانی، لەماڵێکدا دوانزە پیاوی لێبوو لە حەوارییەکان، واتە : عیسى لە هەمان ماڵدا دەرچوو کە حەوارییەکانی لێبوو، دڵۆپ دڵۆپ ئاوی لەسەریەوە دەهاتە خوارێ،

وتی : بەڕاستی هەریەک لەئێوە دوانزە جار کافربوون بە من و باوەڕتان بەمن نەکرد دوای ئەوەی کە ئیمانتان بەمن هێنابوو،

وتی : کامتان شێوەتان وەک شێوەی منە، لە شوێنی من بکوژرێت، وە لەگەڵ من دەبێت لەپلەدا، بچووکترین گەنج لە نێویاندا هەڵسا - واتە لە نێویاندا تەمەنی لە هەموویان بچووکتر بووە - ، عیسى علیە السلام پێی وت : دانیشە، پاشان هەمان شتی دووبارە کردەوە بەسەریاندا، دووبارە گەنجەکە هەڵساوە،

عیسى علیە السلام پێی وت : دانیشە .

پاشان هەمان شتی دووبارە کردەوە بەسەریاندا، دووبارە گەنجەکە هەڵساوە وتی : من .

عیسى علیە السلام وتی : ئەوە تۆیت .

شێوەی عیسی علیه السلام یان دۆزیەوە، عیسی لە پەنجەرەی ماڵەکەوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان - روزنة : بەمانای بەشێکی کراوەی سەقف یان دیوار دێت، هەروەها بە مانای پەنجەرەش دێت - .

وتی : ئەوانەی کە بۆ عیسی هاتبوون، هاتن هاوشێوەکەیان برد، کوشتیان و پاشان هەڵیانواسی،

بەشێکیان دوانزە جار بێ باوەڕبوونەوە بە عیسی علیه السلام دوای ئەوەی کە ئیمانیان پێی هێنابوو، جا ئەمانیش بوونە سێ کۆمەڵە .

کۆمەڵەیەکیان وتیان : الله لەنێوماندا بووە هەرکات بەویستی خۆی ، پاشان بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان، ئەوانەش یەعقوبیەکانن .

کۆمەڵەکەی تر وتیان : کوڕی الله لەنێوماندا بووە بەویستی الله، پاشان بەرزکراوەتەوە بۆ لای خۆی، ئەوانەش نەسطوریەکانن .

کۆمەڵەکەی تر وتیان : بەندەی الله و نێردراوەکەی لەنێوماندا بوو بەویستی الله، پاشان بەرزکرایەوە بۆ لای خۆی، ئەوانەش مسوڵمانەکانن .

ئەو دوو کۆمەڵە دەرکەوتن بەسەر مسوڵمانەکان و کوشتیان، بۆ ماوەیەکی درێژ ئیسلام شوێنەواری نەمابوو تاوەکو الله محمد ﷺ نارد .

---

: ڕوونکردنەوە :

یەعقوبیەکان پێیان وایە کە مەسیح الله یە، وە الله و ئینسان یەک سرووشتیان هەیە کە ئەویش مەسیحە،

بەڵام الملکانی و نەسطوریەکان دەڵێن مەسیح دوو سرووشتی جیاوازی هەیە، سرووشتی اللاهوتیة وە سرووشتی الناسوتیة .

اللاهوتیة : کە ئەو وشەیە لەلای نەصارا بەکاردێ، کە بەمانای پەروەردگارێتی دێت .

الناسوتیة : بریتیە لە مرۆڤێتی، کە مەبەستیان پێی جەستەی مەسیحە کە درووستکراوە لە خوێن و گۆشت .

هەروها النسطوریة : ئەوانەن کە هاوەڵی نسطور الحکیم بوون، کە لە سەردەمی مەئمون دەرکەوت، بەپێی ڕەئی و حوکمی خۆیەوە مامەڵەی لەگەڵ کتێبی ئینجیل دەکرد .

**١٢٣ - مجاهد** لەم ئایەتەدا : ﴿وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ﴾ **(سورة النساء - ١٥٧)** .

وتی : پیاوێکی تریان لەغەیری عیسی هەڵواسی، وایان دادەنا کە عیسی یە (علیه السلام) .

**١٢٤ - أبا سعيد** لە وتەی الله تعالی : ﴿وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ﴾ **(سورة النساء - ١٥٩)** .

دەڵێت : پێش مردنی عیسی، الله تعالی عیسی بەرزکردەوە بۆ لای خۆی، وە الله پێش ڕۆژی قیامەت عیسی دەنێرێتەوە بۆ لایان کە چاکەکار و خراپەکار باوەڕی پێدێنن .

١٢٥ - **مجاهد** لەم ئایەتەدا : ﴿وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا﴾ (سورة النساء - ١٦٠) .

دەڵێت : ڕێگر بوون لەحەق .

١٢٦ - **مقاتل بن حيان** لە تەفسیری هەمان ئایەتەدا دەڵێت : ڕێگربوون لەدینی الله تعالی، وە لەوەی کە ئیمان بە محمد ﷺ بێنن .

١٢٧ - الراسخون في العلم کێن؟

﴿لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾ (سورة النساء - ١٦٢) .

لە أبو الدرداء رضي الله عنه، لە رسول الله ﷺ کە پرسیاری لێکرا دەربارەی : الراسخون في العلم؟

فەرمووی : هەرکەسێ بەوەفا بێت لە بەڵێنەکەی، وە زمانی ڕاستگۆ بێت، وە دڵی جێگیر بێت، وە هەرکەسێ سک و داوێنی بپارێزێت، ئەوا لەوانەیە کە جێگیرن لە عیلمدا .

١٢٨ - **ابن عباس** لەم ئایەتەدا : | لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ | (سورة النساء - ١٦٢) .

دەڵێت : ئەو ئایەتە دەربارەی عبد الله بن سلام و أسيد بن سعية و أسد بن عبيد دابەزی لەوکاتی کە جیابوونەوە لە یەهوود و شایەتیاندا : بەوەی کە بۆ رسول الله ﷺ هاتووە لەلایەن الله ـەوە حەقە، وە ئەوانیش لە کتێبی خۆیان دەربارەی رسول الله ﷺ بینیبویان .

١٢٩ - **قتادة** لەم ئایەتەدا : | لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ | (سورة النساء - ١٦٢) .

دەڵێت : الله تعالى ئەوانی جیاکردۆتەوە لە ئەهلی کیتاب - واتە ئەوانەی کە لەدوای ئەهلی کیتابەوە هاتوون - ، کە لەواندا هەبوو ئیمانی بە الله بوو، وە بەوەی کە بۆیان دابەزی بوو، وە بەوەشی کە دابەزی بۆ پێغەمبەری الله ئیمانیان پێی هەبوو و بەڕاستیان خستەوە، وە دەیانزانی کە ئەوە بەحەق لەلایەن پەروەردگارەوە .

١٣٠ - کۆتا ئایەتی سورەتی النساء .

**أبو الزبير** واتە جابر دەڵێت - ئەو ئایەتە - دەربارەی من دابەزی : | يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ | (سورة النساء - ١٧٦) .

- الكلالة : ئەوكەسەی دەمرێت بەڵام هیچ مناڵ و دایک و باوک لەدوای خۆی جێنامێنێت - .

|فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ |

١٣١ - **جابر** دەڵێت : کە نەخۆش بووم رسول الله ﷺ هاتە لام، بەمنی فەرموو : ئەی جابر، من بەمردوویی دەتبینم لەمڕۆوە، بۆ خوشک و براکانت ڕوونبکەوە - واتە دەربارەی میراتیەکە - ،وەسێتیان بۆ بکە بە دوو لەسەر سێ.

|وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ |

١٣٢ - **سعيد** دەڵێت : واتە برای مردوو.

|فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ |

١٣٣ - **ابن عباس** دەڵێت : جا بچووک بێت یان گەورە .

|يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ |

١٣٤ - **مقاتل بن حيان** دەڵێت : بەشی میراتی بپارێزیت و نەیدەیتە کەس، ئا ئەوە گومڕاییە کە کۆمەڵێ برای هەبێت، ئەگەر کوڕی نەبوو ئەوا لەگەڵ باپیری میرات وەردەگرن لە کلالەدا .

|وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ |

١٣٥ - **سعيد بن جبير** دەڵێت : واتە : لە دابەشكردنی میرات و جگە لەوەش - الله پێی زانایە - | عَلِيمٌ | .

. تم الحمد لله، وبفضل الله تعالى .

لینکی کەناڵ :

https://t.me/Alaikumbisuuna